ناوی کتێب: شەوەکانی ئامیتا بە درێژایی بابل
بابەت: شیعر
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: خالید محەمەد
بەرگ: نەرمین مستەفا
ژمارەی سپاردن:
نرخ:
دەزگای چاپو پەخشی سەردەم
کوردستان-سلێمانی 2007

# سەر لە ئێوارە

بەر لە"شەوەکانی ئامیتا...." دەبوو بگەڕێمەوە لای مێژووی کۆن. لەبەرئەوەی لە خەونمدا جەستەی ژنی بەفرم دیبوو چۆلەکەکانی مێژوو بەسەریەوە دەیانخوێند. ئامیتا، یان ئامیتاس، یان میدیا لەو خەوەدا چووبووە دۆخی بەفرەوەو ئەوەش بۆ من شتێکی ئاسایی نییە، هەموو جلەکانی من لە ناو بەفردا هەڵخراون و پێ دەچێ بەفر بووبێتە چارەنووسی بارینم. ئامیتا ژنی نەبوخزنەسر کچی

پاشایەکی میدیایی بوو، خەڵکی هەمەدان، هەن دەڵێن سەمیرامیس بووە، ئەوەیان کێشەی مێژووەو ئەو دەتوانێ بۆ خۆی ساغی بکاتەوە، بۆ من ئامیتا ئەو شوێنەی پڕکردەوە. پاشای بابل بۆ کچە میدیایی باخچە هەڵواسراوەکانی دروست کرد کە یەکێکە لە کارە سەرسووڕهێنەرەکانی سەردەمی زوو. ئەو مێژووە کۆنە لە بەرئەوەی تێکەڵێکە لە ئەفسانەو سیحرو گێڕانەوە خولیایەکی زۆرم پێیەوە گرتووە. شاعیران بە جۆرێك تەماشای مێژوو دەکەن جیاواز لەوەی مێژوونووسان دەیبینن، لە پرۆسەی خۆ رزگارکردن لە تەونی جاڵجاڵۆکەیی مێژوو شاعیران هەوڵدەدەن تۆماری شتێکی تر بکەن کە مەنتیقی شیعر گریمانەی سەلماندی پێ دەبەخشێ، ئەویش ئەو مێژووەیە کە رووی نەداوە، بەڵام دەشێ رووی بداو ئێستاش ئەگەری روودانی لە دەست نەداوە، هەروەها لە داهاتووشدا..

جەستەی ئامیتا کە جگە لەوەی جەستەی ژنێکەو بەهاو جوانی خۆی هەیە، لای من بووە بە شوێنەواری ئەو مێژووە لە بیرکراوەش کە ئەدەبی نێرینەی کوردی بووە مایەی لەبیرچوونەوەی، جگە لەوەش هەمیشە مێژوو بەچاوی پاڵەوانو سەرکەوتوو بینراوەو کەمتر ئەو مافە بە شکستخواردوو و کەسانی تر دراوە کە بەلای منەوە ئەویش لایەکی تری ئەو رۆژگارەیەو ئەدەب زۆرجار لەو شۆڕەکاتانە باشتر دەخوڵقێ لەوەی لە جێگەی بەهەڕمێن دێتە ئاراوە.

کارکردن لە ناو بوارێکی لەبیرکراوی وادا ئێجگار زەحمەتو دژوار بوو، دەبوو بە کتێبە کۆنەکانو ئەفسانەو حیکایەتەکاندا بچمەوە بۆ شارەزایی، بەڵام تەواو ئەوەم

ڕەچاوکرد کە مێژوو فێڵبازەو ئەو بابەتە گەورەو زەقانە زیان بە شیعرییەت دەگەێنن بۆیە بەدوای شتە پەراوێزەکاندا گەڕام.

هەر لە سەرەتاوە بەبیرمدا هات کە ئەم شیعرە پێشکەش ڕەمزێکی ئەو دنیا غەدر لێکراوو لە بیرکراوە بکەم کە مارگرێت جۆرجە، ئەو ژنەی لە شەستەکاندا وەکی ژنە ئاشوورییەك چووە شاخەکانو بووە پێشمەرگە دواتر بەبڕیار کوژرا.

بۆ گیانی ئامیتا!

بۆ گیانی مارگرێت!

زەنبەقە تەڕەکانی بەهەشتی شاعیران

شەوەکانمان درەوشاوەیە بە ئەستێرەکانیان.

دڵشاد عەبدوڵڵا

ئەسکەندەر بە گومانە

داریوش هێشتا لە قەڵایە

ئەی ئەو هەموو بەچکە خائینە نەوەی کێن؟

"ئەو چەند دێڕە لە ئانابازدا پەڕیوە"

پەپوولەی نارنجی
لە مۆمی غەریبی ئالاون
رەگەزی ئێمەن بەسەر ئاگرەوە
"ئامیتا بۆ دۆستێکی"

**لە ناکاو**

**کلووەکان داباڕین**

**بەسەر شوورەی بابلدا**

**چەند دانەیەکیان بەر کوڵمم کەوتن**

**شیرینییان خستە زار**

**فێنکیان کردەوە گوفتار**

**لەگەڵ یەکەم گەیشتندا**

**بە منداڵیمدا هەڵگەڕان**

---

**ئەو شەوە هەتا بەیانی**

**من و بەفرو**

**بەفرو ئەفسانەی چیانشین**

**بەفرو منداڵی سەرزەمین**

**کۆشك و تەلاریان پڕکرد لە خرۆشین**

---

*شمشێر بە دەست و خاقانی و حاشییەکان*

*وتیان بیدعەیە*

*هی وڵاتی غەیرەیە*

*بێ مۆڵەت هاتۆتە مەملەکەت*

*بۆنی مەجووسی لێدێ*

**بەفر چییە؟ پرچی خاوی فریشتەیە**

**با هەر جارەو هەندێکیان دەتاشێ**

**هێشتا بە بەریەوە ماوە**

**عەیامێکی تر دەبارێ**

**خودایە!**

**کە تەمەنی کلووت پێ نەبەخشیم**

**پاکیی ئەوانم لێ مەستێنەوە**

---

*رەگەزی بەفر ئارییە*

*بەدفەڕو ناخودا*

*لەشکر کەوتنە مل پەلدانیان*

*لە چاونووقانێکدا گشتیان*

*سەربڕان*

**رابردوو ئاوریشم نییه لە خۆمی بئاڵێنم**

**کراسێکی دڕکاوییه**

**له هەر کوێوه قۆڵی تێهەڵکێشم**

**ئەوێم پتر دەکولێتەوە**

---

*ئەگەر گۆی زەوی لە لەپی ئامیتا جێگەی ببایەوە*

*وایدەکرد هەمیشە*

*کوێستانی سەر بە بەفری*

*لێ دیاربێ*

*لای ئەو هەموو باخچەی بابل*

*پەنا بەردێکی هەمەدان ناهێنێ*

## شەوەکان

**لە شەوی یەکەمدا**

**هەمووشتی خۆم شاردەوە**

**لە ترسی ناحەزو زمانی ڕیا**

**تەنیا شانەیەکی کۆنم**

**نیشانی پاشا دا**

---

*ئەو شانەیە بەفر ناردبووی*

*بۆ پرچی پەرێشان و پەشێوی*

*شانە هەر بەقەد پەنجەی دۆشاومژە هەندەك درێژتر*

*ئێسکی باریکی باڵندەیەك بوو*

*تۆراو لە گوڵزار*

*پەنجەی وەستایەکی دانا نەخشاندبووی*

*بۆنی بن گوێسووەبانەی ئێوارانی*

*گوندێکی بناری لێدەهات*

**پاشا کە تەماشای کرد**

**سیحری شانە کەوتە سەری**

**ئەو جۆرانە**

**شانەی هەنگووینی کونە شاخانن**

**گەواراو سپینە**

**هەر دە پەنجەی خۆی تێدەخست**

**تامیان هەر ئێجگار شیرینە**

---

*پەڕی نەهێشتووە غەریبی*

*بە زەحمەت ڕێ دەدۆزتەوە*

*لە نێوانی تاڵەکاندا*

*باڵی جارانم هەبایە، شانە دەیوت*

*دەمگێڕای لەو دنیایە*

**ڕۆژی سەڵایە غەریبان ڕۆژی سەڵایە**

**حەشری من لەگەڵ پاشایە**

---

*ناحەسن ئەوانەی بێکەسن*

*ناحەسن ئەوانەی خولیای دوندو بەرزایین*

*ئازار هەمیشە بەرەو سەر ترمان دەبا*

*هەر چەندی سەریشکەوین*

*هەندێکمان هەر دەمێنێ*

*بگەین بەوەی دەمانەوێ*

*ئاویش ئەگەر پەنگ نەخواتەوە ناتوانێ سەرکەوێ*

**زەوی هەمووی یەک زمان بوو**

**زمانی قوڕ**

**کە دەستت لێی دەدا**

**جێی هەر دە پەنجەت دیار دەبوو**

**هێشتا نەمەبیبوو رستە**

**نەیبەستبوو وشەکان**

**نەبوون بە زیخ**

**زمانی وردە ئاسن و**

**زمانی ژەنگ لە بابلدا سەریان هەڵدا**

---

*قوڕولیتەی دوای تۆفانی پێوەیە دەموچاوی*

*دەست و قاچی*

*سیماو رەنگ و*

*دەنگ و ئاوازی ئامیتا*

*هێشتا قوڕینە*

**ئەی بەڕێزو ئیلهامبەخش و شکۆ ئەی مەردۆك!**

**ئەی میری خواوەندان ئەی بەرزو پایەدار!**

**هەی باوەخودا!**

**تۆ کە بە هەردوو دەستی زێڕین**

**کاسەی خۆرت بەرزکردۆتەوە**

**لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە پڕی دەکەی لە شەراب**

**لە ئێوارەوە تا بەیانی دەیخۆیتەوە**

**پیاڵەیان لێ پڕ دەکەی**

**دەیبەخشی بە هەمووان**

**ئەی میری ڕووناکی هەی شەمش!**

**چاوگی نەمری هەی باوەمیر**

**مرۆ وا دروستبووە نەتوانێ سەری بەرزبکاتەوە**

**تەماشای میهرت بکا لە بڵندی**

**هەی مایەی ئومێد هەی باوەخودا**

**لەسەر دیواری کۆشکەوە بنوارە**

**ژنێك**

**نەخشی تۆی کەوتۆتە سەری**

**جلی تۆی لەبەردایە**

**له رەفتارو جوانیشدا وەکی تۆیە خودایە**

---

*حەکیم‌و لوقمان هەگبەی دەرمان و حیکمەتیان هەڵرشت*

*وتیان، پاشا نەخۆشە*

*ئەوانەی سیحریان لێ دەکرێ*

*تایەکی گەرم دەیانگرێ*

*ئەوەی بنبەرێ دێننە سەربەرێ*

**با قامیشەڵانی دەجووڵاندەوە**

**تیرێك لە دیواری بابلی دەدا**

**وتیان دوژمنەو نزیك بۆتەوە**

**مردن بە لەشمان فێربووە**

**هەر جارەو گرفتێکی بۆ دروستدەکا**

**هەر جارەو گوڵێکمان دەبا**

**ماڵی خۆی پێ بۆنخۆش دەکا**

---

*شەوێك بە یەکەوە نووستن*

*دوو شەو بەیەکەوە نووستن*

*سێ شەو چوار شەو پێنج شەو*

*شەش لە شەوی حەفتەمدا*

*ئامیتا لەو تیرەی پرسی، کێ دەیهاوێ؟*

**ئەوانە هەوری بێ پشتن**

**نە دەرگایان دەکرێتەوە نە رازیان دەدرکێ**

**نە کەسیان هەیە نە دۆست**

**لە رۆخی فوراتەوە**

**عومرێکە بازووی گۆج دەیانهاوێ**

**کەوانیان خوارە**

**نایپێکن ئەوەی دەیهاوێن**

---

*پاشا بەسەر پشتی گایەکی باڵدارەوە*

*ئامادەبوو بۆ فڕین*

*پێیەکانی خستبووە سەر قۆچەکانی*

*ئامێتا وتی: زوو بێیتەوە*

*سێبووریمان بەیەکتر دێ*

**لە شەوی هەشتەمدا**

**ئاسمان هەموو ئەفسوونی خۆی**

**هەناردبوو بۆ ئامیتا**

**دەستێکی ناپاك دزیبووی**

**شتێکی پێ دابوو**

**ئەوی تری بەبا دابوو**

---

*یەکە یەکە سوێندیان خوارد*

*کەنیزەکانی حەرەمسەرا*

*لە باخەڵی هەر یەکێکیاندا تاڵێکی دیاربوو*

*پاشا چاوی کەوتە سەریان*

*ئەو شەوە خیانەت پەیدا بوو*

**لە شەوی دواتردا**

**دەفرێکم دەرهێنا لە شێوەی قومری**

**لە بەردەمی پاشام دانا**

**پەڕەکانی سیرامیك و قاچی سەدەف**

**دەنووکی یاقووتی**

**ئاوێکی نازکی لێ دەڕژا**

**دەنکە مرواریی وردی تێ دابوو**

**ئاوی وا نەبوو لە هەموو بابلدا**

**بەر لەوەی بیخۆیتەوە دەبێ سوێندی پێ بخۆی**

**تاماوی بەردی تێ نەهاوێی**

---

*لە دیمەنێکدا*

*پاشا ملی دەفرەکەی گرتووە ناهێڵێ بڕژێ*

**ئەوەی ماوە تێیدا کەمێکە**

**ژیان بەو کەمەوە ماوە**

**خومارو خۆشاو**

**لەو شوێنە پڕ ئەفسوونانە**

**کەیل و دڵشکاو**

---

*کۆمەڵە پیاوێك بە هەموو تەدارەکی جەنگەوە*

*لەبن لێوی دەفرەکەدا*

*ریزیان بەستبوو بەرەوخوار*

*ئامادەبوون بۆ شەڕ*

*دوژمنی ئەوان کێیە؟*

*لەگەڵ خۆیاندا دەجەنگن*

**دەفر پڕبوو لە جەنگی بێهوودە**

**لە نەوەی بێهوودە**

---

*لە ریزی خوارەوە شەڕکەرەکان*

*بە خۆ و بە ڕمەکانیانەوە*

*هەموویان مردبوون*

*لە ناوەڕاستیشدا دووجار*

*سەریان بەرانبەر یەکتری قیت کردبووەوە*

*کلکیان بەیەکەوە نووسابوو*

*نەوەی ئەوانین*

*ئامیتا وتی: لوولووین*

*گووتین*

*گووتی لوولوو*

له كۆتايی شەوا دەفر

چووبووه خەونی هەردووكمان

دوژمنێك بوو شەڕی هەردووكمانی دەكرد

زاری حەزیابوو ئاگری هەڵدەدا

ناوی مەنجەنیق بوو دەكولا

بە زەحمەت هاتینە دەرێ

لەگەڵ تاریك و روون

گەیشتینە ئەوپەڕی گەردوون

چووینە سەر كوورەی سپێدە

دەستمان تێیخست

هەریەكەو باوەشێكمان هێنا

**ئێستا خاوەنی خۆری خۆمانین**

**گەرمترینیان**

**لە ناو باخەڵی تۆدایە ئامیتا**

---

***بۆنی بەفر نیشتبووە سەر لێوی دەفر***

***بەفر هەمیشە زیندوومان دەکاتەوە***

***ناهێڵی هەرگیز بمرین***

***بەفرو شەو دوو دۆستی غەمگینن***

***دەچنەوە یەك ماڵ***

***لەناو یەك جێگا دەخەون***

***هەموو شتێکی لە بەفر دەچێ ئامیتا***

***هەموو شتێکی لە شەو دەچێ پاشا***

**به قسەکانیان باوەڕ مەکەن**

**سەرزەمین پڕە لە ریسووابیەکانیان**

**پڕ بۆدڕی یاساو رێساکانیان**

**زاڵمە دنیا بە چنگی غەدرەکانیانەوە**

**هیچ شتیان لە ئێمە ناچیٚ پاشاکان**

**هەتا گۆڕیشیان جودایە**

**گاڵتەجاڕییە دنیا بە دەستیانەوە**

**گاڵتەجاڕییە مردنیش بە دەست خواوەندەکانیانەوە**

**های لە من**

**های های لە من..***

---

*⋆دەفتەری شاعیرێکی سالووک*

*پڕبوو لە هەجوو*

*ئارامترینیان ئەمە بوو*

**کتێبێك کوێر ببوو**

**هێندەی بخوێنێتەوەو تێنەگا**

**بە ڕێی هەورازو نشێودا هەڵگەڕێ و**

**هەر نەگا**

**لە کۆتاییدا**

**خەونی زڕاوبێ لە ژێر تاجی پاشاکاندا**

**پەتکێکی پساوبێ**

**بە دەستی عەوامەوە ڕاگیرابێ***

---

**لە وەسفی مێژوودا ئەمە نووسراوە*

*تاج هەمیشە لە بەرزیدا ڕاگیراوە*

*سەری کەسێك هەڵکشاوە*

*تا پێیبگا*

*نازانم بۆ تاج دەزرینگێ*

*بەڵام ناشکێ؟*

**خەون بە دنیایەکی دوورترەوە دەبینم**

**دووتر لە مەردۆك!**

**دوورتر لە شەمش!**

---

*لە باڵامبۆ*

*بە منداڵی مۆریمان بە ملی بەردەکانەوە دەکرد*

*نزامان دەکرد شەڕ ببڕێتەوە*

*بابمان بە سەلامەتی بێتەوە*

*هەریەکەو بە خەیاڵی خۆی*

*تیلماسکێکی لەشی دەبەخشی*

*بۆ هەواڵێك کە ڕێبوارێك دەیهێنا*

*کەس نەیدەناسی*

*هەریەکەو خۆی بە لایەکی هەڵدەواسی*

*چەند خۆشبوو تامی منداڵی بە زاری گەورەکانەوە*

**لە شەوی دواترو سالآنی دواتردا**

**نە هەوالٚ ما نە رێبوار ما**

**نە مندالٚی**

**ئەز ئەشقەك دەبێژم بۆیان**

**گرفتارم بە سۆیان**

**خۆتانم نیشاندەنەوە گیرۆدەتانم**

**جەنگم لەگەلٚ ئێوەدا پێ بەرپا ناکرێ**

**جەنگی ئێوەش لەگەلٚ مندا ناعادلە**

---

*لە شەوێکدا*

*ئامیتا*

*ئەو کتێبەی هێنا گۆڕی*

*کە باسی جەنگەکان بوو*

*جوانترین جەنگ منداڵییە هەموو کات پێمان دەوێرێ*

## کتێبی چوارینەکان

**ئەو کتێبە موغێك دابووی بە باوکم بەر لە خۆکوشتنی**

**ئەویش دای بە من**

**بە یادی مەرگێك**

**کە لە هی باڵندەو**

**لە هی گوڵ دەچێ**

**لەکاتێکدا ژیانیان شەماڵێك بووەو چی تر نا**

**کتێبی وا نەبووە بە هیچ زمانێك**

---

*حەرفەکانی دەتوت کلوون*

*بەسەر لکی دارو بارو پەلکی گیا*

*لە هەرلاوە دەتخوێندەوە هەر خولیابوو*

*هەمووی هەناسەی خودابوو*

**کتێب لە ناو کۆشکو سەرادا هەڵیکرد**

**با بوو ئەمان با**

**ئەو جۆرانەی هەموو شتێك رادەپێچیو**

**لەگەڵ خۆی دەبا**

---

*دەستم لە هەر وشەیەکی دەدا*

*مۆسیقاو هەرای هوزارێك بوو*

*دەیچریکاندو نەیدەبڕیەوە*

*رستەکانی حەوزی کەوسەربوون هەڵدەچوون*

*لە هەرلاوە زەنبەقەو پوونگو نەعناع تێکەڵ دەبوون*

*شۆڕشی گوڵە کتێب نییە*

*هێرشی بۆنو بەرامەی سروشتە جەنگ نییە*

**تەڕبوو بالیفی بن سەرمان بە ئەشکی چوارینە**

**جێو بالینگان پڕبوو لە نەشئەیان**

**بابل سەرسام بوو بە ئەندێشەیان**

**چەند مەزەداربوون**

**چ زمانێك رستوونی بە هەودای؟**

**چ روحێك هەڵیداون بە خولیای؟**

---

*ئەی مەردۆك!*

*ئاوی دەماری شیعر برژێنە*

*بەهرەی خۆت بنوێنە*

*دەشتی فورات بە گوڵزاریان بچێنە*

*دڵی ئامیتام لێ مەڕەنجێنە*

**کتێب ماڵی پڕ سیحر کرد**

**کتێب وڵاتی کرد بە سیحر**

**ماڵی کتێب لە کوێیە؟**

**کێ دەرگاوانیەتی؟**

---

*موغی گەورە عاشقی گەورەیە*

*دنیایان نەوەکی هی مەیە*

*بێ شەیتان و فریشتەیە*

*ئەو دنیایە چۆتە پێستی ژنێکی هەمەدانییەوە*

*ئەویش کردوویەتی بە چوارینەو*

*هەڵیچنیووە بە دەوری خۆیدا*

*تا بزربووە*

**ئەو چوارینانە وردە شووشەی خەیاڵی رەشەبان**

**زەردەشتین**

**کە رۆژیان لیّ دەدا دەبریسکێنەوە**

**خەونی درێژیان سروشتە**

**گریانیان جۆگەو رووبارەکانی**

**گوفتاریان لالەزاری**

**بیریان بەفری نزاری**

---

*پاشا دڵی چووبووە چوارینەکانەوە*

*یەکیانم خستە ناو دەستم*

*هێندەم گووشیبوو*

*کە کردمەوە رووناکیی لیّ رژابوو*

*لە پەنجەکانم ئاڵابوو*

*هەر ئەو شەوە ناوی من لە ئامیتاوە*

*بووە ژنی لەپ هەتاو*

**بەو ناوە بانگیان دەکردم**

**باڵندەو ماسیی ناو ئاو**

**هونەرمەندو گۆیندە بە گۆرانی**

**چوارینەیان دادەگیرساند هەتا بەیانی**

**لەو خەوەدا هەمووان کوردییان دەزانی**

---

*خونچەیەك زمانی کردەوە*

*تا گەورەش بوو*

*هەر زمانی گوڵی زانی*

*دەنگی ئاوێك دای لە گوێی*

*هەر بە ئاوازی ئەو ئاوە*

*دەیچڕی گۆرانی*

**ئەسپی سپی غاریان دەدا**

**لە ژێر ئاسمانی لازۆردی**

**ئەو ئەسپانە بگرنەوە**

**یەکێکیان ئامیتایە!**

---

*هەموو جارێ لە خەونیدا*

*دەشتەکان پڕ دەبوون لە گەنم*

*من بەتەنیا هەموویانم دەدووریەوە*

*دەمکردن بە شارا*

*هەموو جارێ لە ناویاندا*

*دەسکێك لە هەمووان پڕتڕو*

*دەنکەکانی گەورەتر بوون*

*ئەو گەنجەینە ئامیتایە*

**له شه‌وی به‌ر له كۆتایی**
**شه‌وێكی مۆری قۆڵ درێژ**
**رێك وه‌كی كراسی ئامیتا**
**له به‌رده‌می ئاوێنه‌دا**
**ئه‌رخه‌وانێكی غه‌مگین بوو**
**شه‌وی به‌ختگرتنه‌وه بوو**
**شه‌وی خه‌ونكردنه‌وه بوو**

---

*ئامیتا له به‌رده‌م ئاوێنه‌دا*
*گوناهه‌كانیش به ئاسمانه‌وه ده‌سووتان*
*وه‌كی ده‌نكه گه‌نم و زیوان*
*ژیان دوو دیووی هه‌یه یه‌كیان گوناهه*
*ئامێتا ده‌یزانی ئه‌و شه‌وه شه‌وێكی درێژه*
*بابل هه‌مووی له ئاستیدا*
*سه‌ره‌ولێژه*

**ئەو شووشەیە پەراسووی فریشتەیە کردوومە بە ئاوێنە**

**چوارچێوەی عاجە**

**ناوی پڕ سیحرو جادووە**

**دانە دانەی دووڕو مەرجان دەردەکەون لە ژێریدا**

**ئەو دۆستە شەرمنە عومرێکە**

**بە دیارمەوە وەستاوە**

**هێشتا دڵم لێی نەشکاوە**

---

*جار جارە بە دزی تەماشای لەشی دەکا*

*ئەو شوێنانەی پێشتر دیووە، کە فەریك بوون*

*ئێستاش جوانیی جارانیان هەر ماوە*

*ئەوە نەبێ بە ئاستەمۆکە هەندێکیان گەچراوە*

**شەوی ئاوێنە یەڵدایە**

**گۆمی روونی تەماشایە**

**ئامیتا دەستی پاشای گرت**

**پێکەوە لە ئاوێ رامان**

**ماسیی رەنگاوڕەنگ دەرکەوتن**

**ئەوانە چین؟**

**منداڵیمن بەدوامدا دێن**

**هەردێن و زۆر دەبن**

**هەتا دێن گەورە دەبن**

**گۆم بەوانەوە جوانە**

---

*لێرەوە هەتا زەمان زەمانە*

*ئامیتا لەو ئاوانە نایێتە دەرێ*

*هەرچی پاشایە*

*تا نەکەوێ تاجی داناکەنێ*

**ڕێیەك دەبینم تۆزی لێ هەڵدەستێ**

**ئەوە منم سەفەر دەکەم**

**ئەی ڕێگای من لە کوێیە؟**

**تۆ خۆت ڕێگای**

**ئەوانی تر پێتدا دەڕۆن**

**تۆ دەریای تۆ شەپۆل و گەرداوی**

---

*پاشا سەری لە ئاوێنە سووڕما*

*خۆری خۆی دی ئاوا دەبوو*

*دڵ لە دڵ مەدە ئامیتا*

*هەرچەندی پیربم مەیلم زیاترە*

*شەراب چەند کۆن بێ*

*تامی خۆشترە*

**شەو هێلانەکی بچووك بوو**

**جێی هەردووکمانی تێدا نەدەبووەوە**

**دەنگی فوراتیش کپ نەدەبووەوە**

**چەند لە یەك دەچن تۆو فورات**

---

*هەموو جارێ هەمان قسە دەڵێیتەوە:*

*ئەو باخچەکانم ئاو دەدا*

*تۆش....*

*حەیف زەمانە*

*جوانیش پیربوو*

*دەگرێ بەهانە*

*لێرەش لە یەك جیاببینەوە*

*لەو دنیا یەك دەگرینەوە*

**شەوی ئاوێنە تەواوبوو**

**ساڵی ئاوێنە تەواوبوو**

**بەفر لە دەرێ نەمابوو**

**هەمووی هاتبووە ژوورێ**

**ماڵ هەمووی کریستاڵ بوو**

**لەش هەمووی کریستاڵ**

**پاشا هەندێکیانی شکاند**

**خۆم هەندێکیان**

---

*هەر بەو حلە مۆرانەوە*

*ئامیتا چووە گۆڕستان*

*بۆ دیدەنیی خۆشەویستان*

*بەردی کێلگەکان هی چیا بوون*

*خۆڵی سەرسنگیان هی دەشت و بەڕیا*

*ئارام بوو ماڵی مردووەکان*

**لە کتێبی موغی عاشقدا نووسرابوو:**

**قوڕ سەرەتایە**

**بەرد کۆتایە**

**منداڵی لیٚ ئالاٚیە**

---

*لە دیمەنێکی دووردا*

*ئامیتا چارۆگەیەکی سیمداری رەشی*

*لەمل ئالاٚیە*

*سەری لەسەر کێلێکدا دانایە*

*خودایە بۆ تۆم دوعایە*

*کەسم لێرە نەمایە*

*مردن بۆ من دڵ ئارایە*

**پەڕی تاوسێك پەیدابوو**

**لەنێوان مردوواندا دەنگێك**

**دەتوت هی نایەكی لازۆردییە**

**لەوانەی ئاسمان لەوپەڕی تەنیاییدا**

**بۆ ڕێبوارێكی دەژەنیٚ**

**پڕ نائومێدی ژیان كاسەیەكی زێڕبوو**

---

*لە دیمەنێکی نزیکتردا*

*کەس دیارنەمابوو*

*بە تەنیا دەنگ بوو*

*هەر ئەو دەنگە خۆڵی دەنواند*

*لەسەر گۆڕەکان*

*هیچ دیار نەبوو*

*بە تەنیا ڕەنگ مابووەوە لە گۆڕستان*

**لە شەوی هەزارو یەکدا**

**لەش قسەی خۆی تەواو کرد**

**لە زمانی گوڵدا**

**کێڵگەکان کە هی پاکیزەیی بوون**

**کێڵرابوون**

**باڵندە تۆویان دەهێنا**

**بەو خاکانەیان وەردەکرد**

**کە هەمووی جێگە برین و**

**شوێن پێی وەرزەکان بوو**

---

*بەبێ روح هیچ شین نەدەبوو*

**لە شەوانی دواتردا**

**حەرفەکانی**

**کتێبەکانی مێژوو**

**مێروولە بوون**

**جەستەی ژنێکی هەمەدانیان دەخوارد**

---

*ئەو دەفرەی کە دەبوو شەڕی نەوەکانی*

*تێدابکرێ*

*یان شیلەی خەمەکانی تێبخرێ*

*دەفرێکی شکاوە*

*لە سووچێکی ژووری حەرەم فڕێ دراوە*

*کتێبی موغ دەڵێ:*

*ئەوەی دەشکێ چادەبێتەوە*

*ئەوەی فڕێ دەدرێ*

*هەڵناگیرێتەوە*

**ئەستێرەیەك**

**لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێ**

**خاچی بەملەوەیە**

**قەفەسێك ماڵیەتی**

**نوێژی بەیانی هی ئەو ئەستێرەیە**

**رووم لە قیبلەیەتی**

**رووناکیی هەرچی کۆشك و تەلارە**

**پڕشنگی تاج و کورسیی هەرچی پاشا و دەسەلاّتدارە**

**ناگا بە ورشەی**

**جوانتر دەردەکەوێ گۆشەی**

**شەو هەرچەندی تاریکتربێ**

---

*بەیانی فێڵباز دەسخەڕۆی داو بردی*

**ئامیتایە**

**چۆن کانی بگێڕمەوە بناری؟**

**پەلکی بدەمەوە داری؟**

**خوێنی رژاو بۆ لەشی هوزاری؟**

**لە سێبەری شمشێری هار**

**چۆن پشکووت زاری خونچەی لالەزار؟**

**شەماڵی شیعر دەتوانێ هەڵبکا**

**تۆزی مێژوو راماڵێ**

**ئاسمانی وشە نەوییە**

**بۆ ئاهی ژنێك**

**هەر ئەمشەو دەچێتە لای خودا**

---

*بەو هەموو زامەوە چۆن تەماشای دەکا؟*

**من راستیی رووناکیم لە تیشکدا**

**بە چاوی کوێرەوە تەماشای چیم دەکەن؟**

**بووکی دەریام لە خەیاڵی هەر یەکێکتاندا**

**گوڵی سووری**

**ناو دڕکەڵان و دەستی بام**

**لە کوێوە دەمبەنەوە هەمەدان**

**دەمکەنەوە بە هەرمێی سەر لکەکانی؟**

**لەو سەحرایە**

**کەس قەدری منی نەزانی**

---

*شاخێك دەگریێ ئاهوفیغانی*

*کوێر دەکا ئاسمانی*

## لاواندنەوەی ئەستێر

**خوشکیّ لە بنی دەریادا/ مەلیّ لە ناو زریان**

**هەور بای هەر دەهاتییەوە**

**باران بای هەر دەباری**

**ساڵ بای وەرزێکت هەر دەهات**

**باخچە بای رەگێکت هەر زیندوو دەبووەوە**

**خوشکیّ بە کیّ بڵێم ماوی**

**بەچی باوەڕ بکەم؟**

---

*بەفرێك هەموو ساڵ لە شێوەی ژنێك دەباریّ*

*خەڵکی دەپرسن: کێیە؟*

*بەفرێك هەموو ساڵ دەباریّ*

*ژنێك هەموو ساڵ دێتەوە*

**بەفرێك هەموو ساڵ دێتەوە**

**ژنێك هەموو ساڵ دەبارێ**

**بەفرێك**

**ژنێك**

**دەبارێ**

**دەبارێ**

**دەبارێ**

---

*ژن ئاوە لە گێتیدا*

*خودایە*

*ئەو ئاوە هەر گەورە دەبێ*

*ئەو زەوییەش هەتادێ*

*هەر بچووك دەبێتەوە*

**ئێسك و پرووسكی ئامیتا باخچەیە**

**هەر گوڵەو هی بۆنێکی**

**هەر شەونم و هی شەوێکی**

**هەر ڕەنگەو خولیایەکی**

**پەپوولەی وەرزێکی بابل بوو**

**هەمەدان هی هەموو وەرزەکان**

---

*دوای ئەو هەموو عومرە*

*کەی کاتی پشکووتنە*

*موغی عاشق لە چوارینەی پایزەدا*

*نوسیوویەتی:*

*داری پیر کەی هی چرۆ دەرکردنە؟*

*کەی*

*هی گوڵ گرتنە؟*

**لە ناکاو**

**بایەکی سارد لە بەفری روحیدا**

**ئاهێك باوەشێکی لیٚ خڕکردەوە**

**لەبن دارێکدا کە هێندەی ئاگردانێکی لیٚ مابووەوە**

**لەشی ژنێکی کافووریان**

**لەو بەفرە داتاشی**

**با وتی قسە بکە**

**دار وتی قسە بکە**

---

*چەند شێوەی لە ئامیتایەو*

*هیچ شێوەشی لە ئەو نییە*

**ژنی بەفر قسەی نەکرد**

**هەتا کۆترێکی سپی**

**بن زمانی پڕ نەکرد لە گمەی**

---

*ئەو کۆترە چەند ساڵ جارێك*

*لەلای باکوورەوە دێ*

*بەسەر ماڵی غەریبان دەسووڕێتەوە*

*خۆی دەدا لە پەلکی درەختی حەوشەیان*

*یەك دووانێکیان دەوەرێ*

*ئەو پەلکانە دەبن بە یادگاری و*

*کۆتر دەڕوا بەیەکجاری*

**ئەوە ڕێی گەڕانەوەیە**

**بە دژوارییەکەی دەزانم هی گەڕانەوەیە**

**ئەی ڕووبار!**

**سێبەری کۆترێك دیارە**

**بە پرچی شەپۆلەکانتەوە**

**ئەو باڵندەیە چووە کوێ؟**

**ئەی بەرد!**

**بۆنی کۆترێك دەکەم**

**بە چەناگەو لاملتەوە**

**ئەو باڵندەیە چووە کوێ؟**

---

*کۆچ ڕوو لە باکوورە*

*نامرادن ئەوانەی*

*سەفەریان بەرەو باشوورە*

**کێ وتی لە دنیادا نەما راز**

**ئەوە نییە من شەیدای ئێوارەیەکم**

**لەوانەی ولأت لە دەستیان رادەکا**

**خۆرهەلأت و خۆرئاوام لەیەك داوە**

**بۆ کاتی ئاوابوونی**

**زەوی بەشی ئەو کاتە ناکا**

**ئاسمانیش بۆی دانانەوی**

---

*ئاوابوون هەمووی وەك یەك نین*

*هی سروشت شتێکەو*

*هی مرۆ شتێکی تر*

*کێ وتی، یەکیان بزربوونی ئەبەدییە*

*ئەوی تریان گەڕانەوەی ئەبەدی؟*

**قەڵایەك هەس لە دوندی عاسێدا**

**یەکیان لە ناو شارنشینان**

**خۆم لە وێدام**

**لە ناو خەڵکیدا قەڵامە**

**نەك لە جێگەی دوورو بڵند**

---

*ئەو شارانەی قەڵایان تێدایە*

*خەون‌و خولیایان جودایە*

*ئەوانەی لەسەر لووتکەدان*

*لە سەرەوە هەر خۆیان دەبینن*

*چاویان ناگا بە خواری خوار*

*شارەکان سروشتی ئێمەیان گرتووە*

**ئەی چەخماخە!**

**لە رەنگتدا زەردییەك دەبینم**

**لە رووم دەدا**

**ئەو رەنگەت لە کویٚ هیٚنا؟**

**لە دەنگتدا هەر دەڵێی من بانگ دەکەی**

**ناوی منت چۆن زانی؟**

---

*ئامیتا لە رێگای گەڕانەوەی*

*قسەی لەگەڵ زۆر دۆستی کۆنو*

*قسەی لەگەڵ ئەوانە کرد کە نایناسێ*

*قسەی لەگەڵ ئەوانە کرد کە دەیانناسێ*

*ئەرێ لەبەر چی دڵم*

*بە قسەی کەستان ئاو ناخواتەوە؟*

**لەوە دەترسم ژەهرم**

**کەوتبێتە ناو میوەکانی روحەوە**

**یان لەخۆبایی بوونی دەریا**

**سەری لە جۆگەیەکم تێکدابێ**

**لەوەش ترسناکتر ئایندەم**

**لە گیرفانی رابردوودا لێ بەجێمابێ**

**ئەگینا لەبەرچی کەس لە من حاڵی نابێ؟**

---

*خەونم دیووە هەر دەبێ بێتەدی*

*خەونی بەرەبەیان و*

*هی کیمیاگەرو شاعیران*

*ئەوەی دیوومانە هەردەبێ رووبدا*

*ئەوەی رووشدەدا*

*ئەوە نییە کە دیوومانە*

*ژیان لێرەوە غەرقی گریانە*

**خەون لە ئەزەلەوە**

**تۆوی هەڵاڵەیە مرۆ هەڵیان دەگرێ**

**لە شوێنێکەوە دەیانبا بۆ شوێنێك**

**خڕیان دەکاتەوە پەرتیان دەکا**

**تا بزریان دەکا**

**خواوەند خەونیان نییە**

**کوا خەونیان؟**

**کە هەرچییان بووێ بلوێ**

**هەر کوێیان بووێ**

**بیگەنێ**

---

*بەینی ئامیتاو خەونەکان پردێك بوو*

*گریان رماندی*

## دوا شەوی ئامیتا

**ئەمشەو بمکە بە دۆستی خۆت**

**جێگەیەکم لە تەنیشت خۆت بۆ راخە**

**بە نازی مانگ و ئەستێرەکان دڵم رابگرە**

**تاریکیش هەرچییەکم لێبکا**

**رازیم بە ڕەفتاری**

**ئەی شەو من و تۆ بۆ یەکتر خوڵقاوین**

---

*ئەی شەو من شاعیری خۆتم*

*شیعرەکان کە جگەرگۆشەمن*

*تۆیان چنیوە*

*بە نووکی چراکانیان*

*شاعیری خۆتم بە چریکەی بێدارەکانتەوە*

**کەشتییەك لە ئاوێکی تاریك**

**لەبەر سێبەری تریفەدا**

**دوو عاشقی بەسەرەوەیە**

**خودایە! بمکەی بە سەوڵی دەستیان**

---

*ئەو دوو کەسە کێن؟*

*لە دوورترین کۆڵانی شەودا*

*ئاو یەکیان دەناسێتەوە*

*کەشتییەکیان دەناسێ*

*یەکیان ئامیتایە دووەم کێ؟*

*گەڕانەوە کەی وابووە؟*

*رووبار نەگەڕاوەتەوە*

*هەمیشە رۆیشتووە*

**ڕێ کوێرە ڕێبوار دەیبینێو ئەو کەس نابینێ**

**بە هەمانشێوە دەرگا**

**لە دوا شەودا**

**پاشا بڕیاری بە دەرگاواندا**

**کۆشكو تەلار خڕ دابخرێ**

**خۆشی کلیلی حەرامسەرای برد**

**لەژێر دارێکدا شاردییەوە**

**بەیانی چۆلەکە دزییان**

---

*ئامیتا لە کوێوە هاتە دەرێ؟*

*شووشەی کام پەنجەرە شکا؟*

*درز کەوتە کام میچەوە؟*

*ئاسمان لە کام لاوە بردی؟*

**ئامیتا دەگێڕێتەوە:**

**چرای ژوورم کوژاندەوە**

**خەیاڵ بە کزی دەسووتا**

**لە پڕ جیڕەی دەرگایەك هات**

**تارماییەك لە شێوەی جوانوو باڵی کردەوە**

**بردمی بۆ سەر فورات**

**بەناو قامیش و جەنگەڵدا**

**سەرکەوتینە سەرێ**

**هەر ئەوەندەی بەبیرهاتەوە**

---

*هەمووومان لەوێ بووین کەسوکار*

*دۆست و یار*

*لە پڕ بەفرێك باری*

**دایە بۆ وا سەرسووڕماوی؟**

**گەنجینەی زێڕو زیوی دنیا**

**بەهای تەماشکردنێکی تۆیان نییە**

**هەموویان دەخەمە ژێر پێت**

---

*ژنی بەفر کە هاتە ژووری*

*یەکەمجار ئاگر حەپەسا بە دیارییەوە*

*پەردە لەرییەوە*

*ئاوی سەماوەر هاتە جۆش*

*زۆر شتی سەیروسەمەرە روویان دا*

*فەرشی ژێر پێی*

*پڕ ببوولە گوڵو بولبول‌و*

*هەمووش دەیانخوێند*

**ئێستا لەویٚ باخەوان نوستووە**

**دەستی بە مانگی حەسرەتەوە گرتووە**

**تریفەی بۆنێکی لێدیٚ**

**هیچ میوەیەك نەیگرتووە**

**بۆنی ئامیتا**

**لە هەموو شوێنێك پەرت بووە**

**لەو رۆژەوە ئەو رۆیشتووە**

**کۆتر لە بابل نەماوە**

**چۆلەکە کۆچیان کردووە**

**گوڵ هەموو خۆیان کوشتووە**

---

*پاشا لە ناو پاشماوەکاندا*

*بایەکی توند لێی دەدا*

*بە زەحمەت خۆی راگرتووە*

**درەختەکان هەموو حۆری بن**

**بابلیش بەهەشت**

**کەسیان ناگەنە شەوێکی ئامیتا**

**ئەی مەردۆك من چیم کردبوو؟**

**ماڵی کێم کاوڵ کردبوو؟**

**باڵندەی کام دەشتو دەرم لە ئاوکردبوو؟**

**ئەی شەمش!**

**تۆ کە هێزی بێپایانی**

**رۆژت لەبەر خۆت کردبوو**

**مەچەکی شەوی تاریکت بادەدا**

**چۆن رێگات بە ئامیتا دا بفرِێ؟**

---

*هەمووی بێدەنگ بوون*

*داناو زاناو خواوەندەکان*

**بابل خۆیخوارد**

**یەکەمجار پاشاکانی**

**پاشان باخچەو کۆشكو تەلارەکانی**

**خۆڵی سوور باری**

**خۆڵی رەش**

**زەرد مۆر**

**یادگارەکانیان داپۆشی**

**جار جار بای شەماڵێك دێ**

**لایەکی لادەباو کەمێکی بەدیار دەکەوێ**

---

*ئامیتاش لێرە دەبارێ*

*دەبارێ*

*دەبارێ*

**بەفرێك هەموو ساڵ دێتەوە**

**ژنێك هەموو ساڵ دەبارێ**

**بەفرێك**

**ژنێك**

**دەبارێ**

**دەبارێ**

**ئامیتا هەر گەورە دەبێ**

**کۆشك و تەلاریش چی یان لێ دێ؟**

---

*لە دوا دیمەندا*

*ئەوەندە فرمێسکم رشتە سەر خۆڵەمێش*

*ئەوەندە پەنجەم لە ناو بەفرێدا تەزی*

*هەردووکیان لە بەر دەممدا*

*زیندووبوونەوە*

*ئامیتاو پاشا.*